شیعر

# شاری مۆم و گوڵفرۆشان


سالاڕ توتمانی



- ناوی کتێب: شاری مۆم و گوڵفرۆشان
- بابەت: شیعر
- نووسینی: سالاڕ توتمانی
- بەرگ: ئەندێش دیزاینەر
- دیزاین: حیکمەت مەعروف
- چاپی: یەکەم
- ساڵی: ٢٠٠٦
- چاپخانە: تیشک
- تیراژ:
- ژمارەی سپاردنی وەزارەتی رۆشنبیری (٧٦٤)

# شیعر و لاپەڕەکان

## پەنجەكان

دایكم لە ئەزەلەوە
یەك پە نجەی بوو
ئەو پە نجەیەش تەنیا پە نجەی پە نجەمۆر بوو
هەمیشە لە پشتی پەراسوی پە نجەرەیەكەوە دەسوتا
تا لەدوا دێڕی دیواری حەوشەكەوە
سەری باوكم و سەری جەلادێك لە یەكتر جیاوە بكات
دەبوو لە لێكردنەوەی تەڵە ریحانێكدا
سەر پە نجەی .. بە ئیستیمپای .. لێوی ئەو تەڕ بكا

باوكم تەنیا پە نجەی پەلە پیتكەی مابوو
خەونەكانی پێ دەژمارد
ئەو پە نجەیەی .. هەمیشە دەكرد بە شانی چیادا
لە تەنیشتییەوە وێنەیەكی لێدەگرتوو
بۆ دایكمی دەناردەوە
ئەویش .. لەسەر سینەی دەیكرد بە مەدالیا و .. و
تەماشای منی تێدەكرد





من ..
منی زادەی پە نجەیەك
جگە لە زمانی شەڕ
زمانێكی دیكەم نەدەزانی .. ژیانی پێ تەرجومە بكەم
من .. منی زادەی پە نجەیەك
جگە لە قورقەپ ..
یارییەكی دیكەم نەدەزانی
تەمە نمی پێ بەڕێ بكەم
تۆ دەتەوێت بەو جوانییەت چیم فێر بكەیت
پەڕەی سپی سینەت بۆچی دەكەیتەوە
من تەنیا بەداری دەزانم
سێوان بخەمە خوارەوە
من تەنیا بە چاو دەزانم . خۆشم بووێیت

با پە نجەكانیشم ( دە .. بن )
بە ڕەوڕەوەی مێژوویەكی سوور پێم گرتووە
با چاوەكانیشم ( دە ..بن )
هەر بۆ چنینەوە و .. هەڵوەرین
دەبینن و كۆ دەبنەوە

ئەو پەنجانەی کە تۆ دەتویست
پەنجەکانتی پێوە موتربە بکەیت و
سێو و هەڵوژەت بۆ بگرێت
تەماشا چۆن لە تۆ هەڵدێن .. دوانەی توتەم
لە منداڵیمەوە تا ئێستەم
پێکەوە هەڵنە پەڕیوون
دووانی تریان هیواکوژن  دۆشاومژەی دۆشاو دزن
ماونەتەوە پەنجە مۆرەی دایکم
پەنجەی پەلە پیتکەی باوکم
ئەویان دەبەم و دەیگەزم
ئەمیان دەبەم و دەیگەزم
لەو دە پەنجەیە گوڵەکەم .. کوا پەنجەیەك
لاولاوێکت بۆ چێ بکا .. بە تەماشاتا هەڵزنێت و
تەرزت بگاتە ئەستێران
قردێلەیەك گوڵت بۆ بدات لە پرچت
لەو دە پەنجەیە دڵەکەم
کوا پەنجەیەك





کاتێك ترازا دوگمەی سینەت .. بە ئاهی من
پڕیان بداتێ .. بیانچنێت
نەهێڵێت کە دوژمنانم .. بیانبینێت .. بیاندزێت
***

## فۆتۆکۆپی

راستبوونەوەی ..
پەنجەیەکی .. باوکم ..
وەڵامی هەردە پەنجەکەی منی پێبوو
ئەو تەنیا چاوی شك دەبرد
بەخشی بە من
ئاو .. تێیدا .. بە سایە دەڕۆشت
درەختی .. بە قەد و .. گەڵاوە تێدا بوو
پڕ پڕ بوو .. لە زاهید
پڕ پڕ بوو .. لە بەرد
ئەو دوو دەستی هەبوو
لەسەر خەتەکانی دەنووستم
بە ئومێدی خودا
پێکەوە قەزوا نمان .. کون دەکرد
پێکەوە شووشەمان دەشکاند
لەسەر خاولییەك ..
لە تەنیشت .. بەرماڵەکەی .. ئەوەوە
چی دەکرد، چی دەوت





بۆ ئەوەی لە بیرم نەچنەوە
فۆتۆکۆپیم دەکرد
بمبورە کە ناتوانم .. بەو چاوانەوە ..
حەرف حەرف .. ( با ) حونجە بکەم
ئاو ئاوەژوو بکەمەوە
ژیان بنووسم
ئەو دەستانەی من ..
دەستی پیاوێکی دارتاش بوون ..
تەنیا ( تابووت )ی پێدروست دەکرد.
***

## ئاوێنەی پێنجشەممەکان

لە نێوانی .. ئەم بڕین و ساردبوونەوەی ..
گەردنی ئیسماعیلەدا ..
هێندە راماین ..
تا بووینە پەیکەرێك لە گومان ..
لە دووڕییانەکانی فتوادا ..
هێندە خزاینە پشتی دوو پە نجەرە
هەیبە تمان شکا ..
تا گوڵدانەکانی نەشکاندین رەشەبا ..
نەسرەوتین ..
شێتییە ..
تازە شێتییە ..
دەمی چەقۆکا نمان ..
بە حەرفەکانی ( وضحی ) دەساوین
هێڵەکانی ( الم نشرح )
لەسەر ئەم پارە قەڵبانە ناکێشرێن
پێناچێ .. ( بنیامین )
سوجدەی سەهوو بنێتەوە بەرپێی ( یەعقوب )





پێناچێ ..
دارهەنارەکانی تەنیشت .. ئەم فارگۆنی دایەلۆگانە بەر بگرن ..
جا با ئەم پێنجشەممەیەش ..
دانەکانی من و
سێوە گەیوەکانی تۆ
رووت ببنەوە بۆ یەکتر ..
خۆ هەینییەك شك نابەین ..
تێیدا ( با ) نووستبێت
درەنگ بوو ..
بۆ ئاوێتەبوو نمان ..
زوو بوو
کەڵەشێرێکمان نەهێشتەوە بۆ تۆ و
درەنگ بوو ..
چە پڵە بۆ فڕینی کۆترەکان ..
زوو بوو ..
مریشکەکان لە کایەنی دراوسێکان ..
هێلکەکانیان دۆڕاند
ئێمە کە سێشەممەیەکمان نەبێت

چەقۆکانی تیا حەرام کەین
چی لە ئاوێنەی ئەم پێنجشەممانە بکەین!؟
سەرمان تێیدا سپی ..
هەناسەمان پڕ لە وەرین
تەماشامان پڕ لە رامان
تازە بە من و تۆ چی ..
کەنارەکانی ئەم ئێوارەیە
ئاستەنگەی چینەکانی حەوشە .. بڵندترە
لە دەنکە جۆکانی تۆ و
لە پەنجە یاخییەکانی من ..
تازە نە سنوورەکانی باوك ..
لە سەرەڕۆیی ماچەکانمان دەترسێت
نە بازگەکانی مەنفا ..
لە بێ ناسنامەیمان ..

***





## یاسای سروشت

بنوارە بۆ ..
رێوڕەسمی ئەو جۆگەلانە ..
ئەوانەیان .. کە پێچەوانەی " ئاو " دەڕۆن
نایانەوێت بچنەوە بۆ باوەشی " چەم "
پێڕاناگەن .. لەسەر قەدی سنەوبەرێك
ئاهێك بۆ روبار هەڵکۆڵن
شیعرێك بۆ دەریا بنووسن

سبەی شەپۆل .. نایانلێتەوە
لە مارشی دەریادا
سبەی هەورێك وەچەی ئەوانی پێ نییە
لە شنەی پەلکە گیایەکدا
یاسا و .. رێسای ..تولەڕێ و ..
کوێرەرێکانیش
هەرووەهایە ..
نەچنەسەر پشتی یەکتری .. و
بێ یەکتری .. بچنە لوتکەش ..

گلۆر دەبنەوە بۆ نشێو ..
نابنە شارێ و ناگەن بە بەر
یان لەبەر کەندەلاَنێکدا ..
سەردەنێنەوە بۆ مردن ..
یان دوا هەنگاویان .. روو دەنێت
لە ئەشکەوتی دێو و درنج
بازنگی ئومێد .. ناکەنە ..
مەچەکی ئاسۆی دوور
هەر گابەردێك بێتە رێیان ..
دەیانکات بە چەند ریانێك

ئێمەش زادەی ئەو سروشتەین
گەر پەنجەکا نمان .. لە یەکتر گرێ نەدەین
( با ) دەمانبات
کەسێك شوێنپێمان هەڵناگرێت بزر دەبین
نە دەرگایەك سپێدەمان دەکاتەوە
نە منداڵێك .. باوەشی بۆ ..
ئێوارەمان دەگرێتەوە





مەرگ پرسمان پێناکات
یەك یەك دەمانچنێتەوە
ئاخ لە سەختی ئەم جۆرە مەرگە گوڵەکەم
داخ لە داخی ئەم شێوە زەخمە دڵەکەم
پەلی جۆگات ..
بدەرە دەست لە پی جۆگەم
شینی دەریا
لە نیگامدا شەپۆل دەدا
سەری رێگام ..
بسپێرە بە بەرپای رێگات
لوتکە سەری ..
بۆ هەنگاومان ..
نەوی کردووە ..
بۆ گەیشتن .. بە هەتاو و
چنینەوەی پرشنگی ئەستێرەکان و
تریفەی مانگ

***

## سەرگوزشتەی درەختێك لە سیمای ئەودا

- پێشکەشە بە گیانی شێخ ئەنوەر

بە لقێکیەوە ... دیلانێی منداڵێ هاتوچۆی دەکرد
چەند کۆترێکی رەنگ نەکراو ..
لەگەڵ چەند دانە چۆلەکەی
هەڵهاتوو لە دانە و دوای راوچییەکان
لقێکی تریان
لە شان و شەوکەوتی ئەو ..
کردبوو بە هێلانە و بە ماڵ
لەسەر سەری ئەوەوە
زۆر زەرنەقوتە ... باڵیان گرتوو و
ئاسمان و ئەستێرە و مانگ و
هەتاویان تەماشا کردوو
رژانە نێو کۆشی ژیان
ئەو باڵندە کۆچەرییانەی
لە ترسی زستانی کوێستان
کۆچیان بەرەو گەرمێن دەکرد
ئەویان کردبوو بە نیشانە







چونکە هەتاو یەکەمین( پێی )
لەسەر لقوپۆپی ئەو دەنا ... کە هەڵدەهات
دەیانناسی
ئەوانەی لەگەڵ شمشاڵدا ئاشنا بوون
ئەو دەمانەی تەرزە و بەفر
رێگاکانی دەسڕییەوە
تەم ماوەی بینینی دەکوشت
هەمیشە چەندین بزر بوو
لە سایەیدا یەکتریان دەدۆزییەوە
ئەو ئاشقانەی
بستێك زەوی و ژێری گەزە ئاسمانێك بۆیان قات بوو
کە هەڵدەهاتن لە خەنجەر
کە پشتیان دەکردە کلتور
سێبەری ئەو لەسەر تەوێڵیان هەڵدەنیشت
ئەو وەکو ئەرخەوان نەبوو
لە بەهاراندا گوڵ بگرێ و
لە زستاندا رووت بێتەوە بۆ رەشەبا
ئەو ساتانەی شەختە و زریان

دەست و پە نجە و پێڵوی زەوییان دەرچان ... گوڵی دەگرت
ئەو خۆی بوو خۆی
بە بەری هەنار و هەرمێ رازی نەبوو موتربەی کەن
لەبەر ئەوەی باخەوان هەڵینەکێشێت
ئەو هەر وەرزەی جۆرە میوەیەکی دەگرت
ئەو هەنار بوو لە هاویندا ... دەمی واقعی دەتەقاند
کە سێو وەرزی بەسەر دەچوو
ئەو تازە گوڵی بۆ سێوان هەڵدە پێچا
درەختێکی زۆر سەیر بوو
لەگەڵ تابووتساز نەیار بوو
وەلێ کە دەریای دەبینی
حەزی وابوو بێ بە کەشتی
بۆ هیچ مردووشۆرێك نەبوو بە تاتەشۆر
جارێك جەلادێك لقێکی چەماندەوە بۆ( حەیزەران ) دەمی خوار بوو
ئەو خویەکی تری هەبوو
سێبەری هیچ درەختێکی دارستانی لەسەر نەبوو
هەمیشە دەیفەرموو ( کاردۆخی ) فەرموویەتی
( حەقی پاچینە درەختێك بۆ دارێتر کە سێبەر کا )





چەندین جار رجای پادشای شکاندووە
بۆ دالآنی کۆشکی بیکەن بە کۆڵەکە
ئەوەی رووی لێنابێت بیکات بە پە نجەرە
هەرگیز دڵی نەشکاندووە
زۆر جار
مشاریان راسپارد بۆ وتووێژ
رازی بکەن ببێت بە کورسی
ئەو دەیفەرموو
جگە لە تیرۆك و پنە
بمکەن بە هەر شتێکی تر ... قرپم دەشکێم
ئەو دەیووت من
چریوە لە دڵما لێدەدات
ناتوانم ببم بە قەفەز
یەك رووی هەبوو
نەیدەتوانی لە پشتی چەقۆوە مشت بێ و
لە حاڵی دەروێشێکدا ( دەف )
گوڵدانسازەکان بۆگوڵدان
گڵی ژێرپێیان هەموو برد

بۆ نێو کۆشك و ژێر پێنانی گوڵ و پەروانەی پلاستیك
گوڵفرۆشەکانیش هەموو
بۆ گوڵبارانکردنی جەنگ
گوڵەکانی سێبەرەکان چە پك کرد
تەماشایان پڕ کرد لە بەردی ڕەنگاوڕەنگ
ئەو دەیزانی بەلادا دێت
ڕەشەبا دەیدۆزێتەوە و
لە ریشە هەڵیدەکێشێ
هێلانەکانی نێو سەری وێران دەکا و
خەونی ڕەنگ نەکردنی ئاو نایەتە دی
بەڵام بە شوێن شاکاری مەرگێکدا وێڵ بوو
بەری ئەوبەر بەم بەرەوە گرێیدا و
گشت ڕەنگەکان لە دەنگەکاندا تێکەڵ کات
هەروا دەرچوو
چونکە بالای کەڵەگەت بوو
ئەو ڕۆژەی کە دارایەوە
سەری بە ئەوبەر گەشت و
بوو بە پردی پەڕینەوە





بێ بڕوانە .. ئێستە کچێك لەوبەرەوە ڕاوەستاوە
چاوەڕوانی پەڕینەوەی کوڕێك دەکات لەمبەرەوە
تەماشاکە ...
ئەگەر ئەو پردە نەبوایە ... بە تەوێڵی ئەو ڕووبارەی لیخن بووە
ئەو مامزە لە تفەنگی ئەو ڕاوچییە هەگیز قوتاری نەدەبوو
بە پێوە بێت یاخود بەراکشانەوە
بۆ درەخت هیچ گرنگ نییە
ئەگەر ئەو دەم
پۆلە مەلی بۆ فڕین باڵ پێگرت بێت
بۆ قریوە و پێکەنینی مناڵەکان بە گەردنی دیلانێی بۆ چێ کردبن
ئەوا ئێستەش
من و تۆش بەسەر جەستەیدا دەپەڕینەوە بۆ ژیان
***

## كیژه گیان

بەرلەوە .. بەغدا
بۆنی سێو فۆتۆكۆپی بكات .. و
جووتێك سەرپایی
دەستم بگرێت .. و
بەسەر پێڵاوی مەنفادا
سەرم شۆڕ بكاتەوە
لێرەدا لەسەر پەلكی ئەو گیایە
شانم دادا بوو
كوڵك و مووی مێژووم
( شەن ) دەكرد
بە پە نجەی هزرم
دەمدا بە دەمی
تەشی خەونەوە
رانكوچۆغەیەك شاڵم چیٚ دەكرد
بە كراسی دڕاوی
سپی ئەو بەفرە دەخەنیمەوە





كە چەند رۆژیٚ تر
خۆر دەپیرواند و
شۆخێك لە ژێریا
كە خۆشمدەویست
بۆ ئاوێزانم رووت دەبووەوە
بەر لەوەی لەسەر لافیتەیەكدا
نیوەم راكشیٚ .. و
نیوەم ببێتە ئاردی ناو درك
بەر لەوەی لەبەر كڵیسایەكدا
چەند سەنتێك بمكات بە قەترەیەك ئاو
چنگی ئەستێرەی نامۆ بە روومدا بتریقێنەوە
پرسیار بە پرسیار
لە خۆرهەڵات و لە خۆرئاواوە
دەهاتن بەسەر سیحری چنینی
كلاّشەكانی پێمدا دەكەوتن
جاڵجاڵۆكەرە لە شێوەی جوانی
رایەڵەی فەرشی .. من تەونی دەكرد
ئەو دەمە ئیدی بەغداد تورە بوو

لە شاڵەکانم گەزێکی بڕی
لە شمشاڵەکەم نەختێ هەناسە و
تاکێك کلاَشمی برد .. تاوەکو لەوێ
لە تاقیگەدا بیانپشکنێت
شاڵیان پیشانی میکرۆسکۆبێك دا
بەهاریان بینی
شمشاڵیان ختەسەر لێویان یەك یەك
ئامادە نەبوو هیچیان بۆ بڵێت
بۆنیان کرد بە بۆی هەناسەمەوە
سێویان بۆن کرد
لە کلاَشەکەمدا تەنیا ژەهریان بە خەیاڵدا هات
بۆ دیلکردنی تاکەکەی تری

***





## تۆ

جەللادان شین و مۆر بوونەتەوە
لە دەمی سووری برینێك ... ورد دەبنەوە
لە پشت ئەم برینەوە .. تۆ هەیت
بۆیە ئۆخەی بە لێوی قامچیان نادات ئەم برینە
ئەو کە ئیستێ پاسەوانانی پادشا .. رای ناگرێت
بۆ دزینی ئەسپی کەحێلی ئەوان
بە قەڵادا هەڵدەزەنێت و ناترسێت
تۆ ... یان بەڵێنت پێداوە
یان لە پێشییەوە رێ دەکەیت
تۆ ... کۆمایەکیت هەمیشە
دەمانبەیتەوە سەری دێڕ
لە تەنیشتەوە تەنیا ئاو .. تەنیا ئاو لە تۆ دەچێت
درەخت لە تۆ دەچێت ئەو دەمانەی چرۆ دەکات
لە تۆ دەچێت ئەستێرە و مانگ بەلاَم هەتاکو ئاوابوون
رێگا لە تۆ دەچێت ... کاتێك کە دەگاتە لوتکە
ئەو کەبەزی باڵی ئومێدی هەڵوەری

ئەو کە خۆی کوشت ژیان لە چاویدا وەستا تۆی نەدی بوو
کاتێك رووت رووت دەبوویتەوە
هەتاو خۆی دەچنییەوە لە چاوانتا
ئەو کە تۆی کوشت
ئەو ساتانە تۆی نەدی بوو
وەك دەریا شەپۆلت دەدا .. و
لەگەڵ کەناردا جووت دەبوویت
بۆیە ترس پێیخەنی
بۆیە مەرگ پاڵیتەنی
پەنجەی تۆ نەیدا لە پەنجەی
جاریٚ رێکنەکەوت ... کە بۆن کات ... بە بۆنی هەناسەتەوە
ئەوان کە دڵیان بوو بە بەرد
ئەوان کە شمشێرەکانیان سور کرد بە دەرد
گریانی تۆیان نەدی بوو
دەستیان بە تۆ رانەدەگەشت
تۆ کێیت ...؟
کە خوداوەندیش نیت
وا ئەو بێ تۆ کۆشکی مێشکی ...



شاری مۆم و گوڵفرۆشان
سالار توتمانی

ناوەتە ناو لە پێی دەستەکانییەوە
تۆکێیت..؟
کە ئۆکسجنیش نیت وا بەبێ تۆ
ژیان بستێك ناڕواتە پێش
بێ بوونی تۆ لە هەوادا ژیان
هەناسەیەکی تر ... هەناسەیەکی تر نادا
تێگەشتم بۆچی ئاین تۆی لە پەراسووی
چە پێ من هەڵێنجاوە
تا لە تەنیشتمانەوە بڕۆیت ...
ئەی ( ژن )
ئێمە هەمیشە دەترسین ... لەوە دەترسین
کاتێك کە لە پێش مانەوە دەڕۆیت
بڕۆیت و ئاوڕ نەدەیتەوە

***

# چەکچەکێنە

بە منداڵی .. لە گەمەی چەکچەکێنە دا ..
دەبوو ببین .. بە دوو دەستە ..
نیوەمان بە جاش ..
نیوەکەی تر بە پێشمەرگە ..
لێمان دەبوو ..
بە مشتومڕ ..
کەس نەدەبوو بەو نیوەی تر ..
ناچار دەبووین ..
بە ( قیرو بیر ) ..
ئەوم لە بیر .. ئەمم لە بیر ..
بۆ دواین جار
بەش دەبووین و
دەچووینە دوو سەنگەرەوە
بەدرۆینە ..
بۆ مردن دەداراینەوە ..
هەموو لەوە تێگەشتبووین ..





کە پێشمەرگە .. لە کۆتایی گەمەکەدا ..
دەبیاتەوە ..
وەلێ کاتێ کە گەورە بووین ..
گەورەیمان فێری کردین ..
ئەو دەستە بین ..
منداڵیمان رقی لێ بوو ..

***

## پاشا

ده پەنجەی هەیە .. پادشا ..
ئێمە یەك پەنجەیمان دیوە ..
هەتا ئێستە
ئەو کاتانەی بۆمان دەدوێت ..
ئەو کاتانەی هەنگوین دەخوات
دوو چاوی هەیە .. پادشا
وەلێ نازانین ..
دەبینن .. یان ..
نابینان ..
رەش و گەشن
کاتێ چەپڵەیان .. بۆ دەکوتین
گۆمی خوێنن
تینووی خەون ..
ئەو ساتانەی
یاساوڵی ..
بەر کۆشکەکەی .. دەمانکوژن ..







دوو گوێچکەی هەیە پادشا
وەرن پێکەوە .. پێی بڵێین
کوژراوەکانی ئەم جەنگە ..
لە کوێ بنێین
جێگای کۆشکی ئەو نەبێت .. و
ئێمە .. بیکەین ..
بە گۆڕستان

***

# شاری مۆم و گوڵفرۆشان

لە هەڵە بجە ..
لە دوکاندارێکم پرسی ..
بۆچی لەگەڵ ..
سمڵ و مێخەك و ڕیحانە و
سێو و هەنار و گێلاس و کلی چاو و
دەرزی و دەزوو و شاڵ و شمشاڵ و کلاش و
دار و پەردووی داروخاودا ..
مۆم و بوخورد و
شقارتە و .. تاجەگوڵینەش دەفرۆشن؟!

وتی ئاخر ..
هەر سەرۆك و لێپرسراوێك ..
وەفدێك یان خودا پێداوێك ..
تەشریف دێنێت بۆ شارەکەم ..
تەنیا لە مۆم و بوخورد و گوڵی پلاستیك دەپرسن

زێوانی گۆڕستانەکەش ..
وتی منیش ..
دوای وەستانی .. چرکەیەك بۆ گیانی ئەوان
مۆمەکان دەکوژێنمەوە ..





گوڵەکان کۆ دەکەمەوە ..
دەیفرۆشمەوە .. بە دوکاندارەکان بەڵام
بەنرخێکی هەرزان.. لەوان ..

***

# هەقی ڤیتۆ

دایکم .. چەندە دڵی خۆشە ..
کە منی دیوە .. بۆ باوکم ..
نا .. بۆ ئەوەی ..
کە سبەینێ ..
بۆی دەبم .. بە کۆشکی شووشە ..
نەك بۆ ئەوەی
دوایین پیاسەی ..
پڕ تەنیایی بۆ دەست دەگرم ..
هەر بۆ ئەوەی دڵنیایی .. بینا بکات ..
لەو سێ بەردەی ..
هەقی ڤیتۆیان .. بەخشیوە ..
بە شان و شەوکەتی .. باوکم

***



شارێ مۆم و گوڵفرۆشان سالار توتمانی

# تابووتساز

تابووتسازێك ..
لە تەنیشت ماڵی خەونەوە ..
گەمەی دێت .. بەو دارمێوانەی
تەرزیان .. بە سوورەچنارەدا
سەردەخەن و
دەیانەوێت ..
چاوە بەرسیلەییەکانیان ..
بە گوێچکەی .. گەڵای ئەوەوە
ڕەش کەنەوە.

***

## گوڵدانساز

گوڵدانسازێك ..
له گڵی تەڕی باخچەی دەهێنا ..
له ئاگری دەهاویشت و ..
له گوڵدانێكدا .. دەیكوشت و ..
لەسەر رووەتی ..
دوو باڵی ..
پڕ له فڕینی پەروانەی ..
به باوەشی (گوڵه مینایەكەوە
دەكێشا

***





## ئاكامی زەردبوون

كه خۆی لادا لێم ..
ئەو فرۆشیارەی
رۆژانه ماچی .. چه پك دەكرد بۆم ..
كه دیم ..
به نیوەی .. ئەو قیمەتەی من ..
به كڕیارێ تر ..
گوڵەكانی دەدا ..
موشتەری دوێنێم ..
چووم له ئاوێنەی تەمەنم روانی
ئەویش .. رووی گێڕا و .. لەوی دەڕوانی
زانیم له نیوه لایداوه رێگام ..
ئەوەی دێته رێم ..
سڵاو له نیگای مندا تۆو دەكا ..
تابووتسازێكه ..
ئەوەی پێمدەڵێت .. چۆنی چلۆنی ..
تاتەشۆرێكه ..

کاتێکیش بەرپێی .. خۆم تەماشا کرد ..
دیم مودەتێك بوو ..
بە خوێنم .. پەنجەی خۆیان سوور دەکرد ..
دڕکەزی پیریم ..
چەند بێ منەت بوو ..
نەیفەرموو جارێ ..
بەم زستانەی من ..
با گوڵێ لەسەر دوا نیگات چێ کەم ..
لەبەر مامەڵەی گەرمی بازاڕ و
موشتەری ئەمڕۆی
داخ .. نەیزانی چۆن ..
چۆن دەرچوو .. گیانی موشتەری دوێنێی
***





## دوایین گۆرانی بۆ ئەوین

چی بکەم .. لە دوایین ..
تەڵەشقارتەی .. تەڕی نێو پەنجەم ..
ئەگەر پێشبێ ..
هەر خاکی بەرپایی .. خۆم ڕۆشن دەکا ..
تا تەڕ بوو دڵی ئارەزووم .. گیانە
بەهەشتی شێوەت ..
دەشاردەوە لێم ..
بۆ بەهەشتی خوا ..
تا تەنگ نەبوو بوو.. دڵم بە ژیان ..
تا هەرزە بوو بیر ..
تۆ گوڵەکانی خەونی ئەم عەشقەت
هەڵدەپروسکاند
دەتچنینە ناو .. فەرشی .. بێدەنگی
سەر ڕووی ئەو تەونەی
رایەڵت کردبوو ..
بەنێو شوورەیی دابونەریتا ..

ئیتر بۆچی بێم ..
هەورازێکی دی دەنێیتە بەرپێم ..
تازە لە پاش چی ..
گڵۆپی سەوزت .. هەڵکردووە بۆم ..
باجی سەر سینەت ..
لەسەر تەماشام .. لاداوە .. ئالآی ..
سپی دوای مەرگم ..
بۆ هەڵدەکەی بۆ ..
تێپەڕی تەمەن ..
چی بکەم لە چەمەن ..
تەماشا .. ئەی یار
رووت بوومەتەوە .. بۆ چڕنووکی ( با )
سپییە هەوری سەرسەرم .. واتە ..
بەفرێ دادەکا .. سەرنجی هیوام ..
ئەو چەند گەلآیەی .. لە چڵ بوونەوە
پاش کەمێکی تر
زۆر دەبن .. دەبن ..
بە فەرشی رێگام ..





گەرچی .. جار جارێ ..
بزەی هەتاوێ ..
دەپژێ لە رووم ..
ئەویش مەبەستی ئەوەیە بڵێ ..
قەت خەنی مەبە
بە بزەی زاڵم
بە خۆشی زستان
چەند بەردەبازێ ..
خزو سافەو لووس ..
بۆ پەڕینەوەم .. شك دەبات ئومێد ..
بەلآم پێمبڵێ .. ئەوبەر بە من چی ..
پە نجەم گۆنەکات ..
بە گوڵێکەوە ببێت بە گوارە
کۆترێ نەبێت ..
سەربالێ .. گەلآی
چڵ و لق و پۆی .. منی هەڵگرتبێت
بۆ فڕینەوە
بشبێ بە بوار پشتی گشت چۆمێ ..

هەر خنکانێك بۆم ..
شەن و کەو دەکات ..
سەرنجی نیگام ..
ئیتر بۆچی بێم ..
هەورازێکی دی دەنێیتە بەر پێم
***





## جوانترین رستە

لە کونی ( هەتیتە ) شەوە بێت
ئەگەر گوڵ ئارەزوو بکات
پەروانە .. دێتە دیدەنی .. و
ماچی دەکات
باوکم .. لە ناو باخچەکەدا
شورای بۆ گوڵەکان دەکرد
دایکم .. ئەو چەند وشەیەی .. دا
بە دەمی یەکترینەوە..،
ئەو رستەیەی لێ دروست کرد
هێشتا .. باوکم .. لەسەر قرتکردنی .. تەرزی
لێوەکانی .. دایکم .. نەبوو بووە.. کە پەروانە و.. گوڵ
بوو بوونە .. هێشوو ..
دەیانویست ببن بە ترێ
***

## یادێك

لە بیرت دێت ..
ئەو شەوەی .. مانگ ..
لە دەریاکەی تەنیشتمانەوە .. خۆی دەشت
مەبەستم .. لەو شەوەیە .. کە
تۆ قامکت بۆ دەریاکە رادەکێشا .. و
بە منت .. وت ..
ئەگەر دەریا .. نەبوایە .. بە ئاوێنەی مانگ ..
مانگ چی دەکرد؟
ئاخۆ .. ئێستە ..
ئەو وەڵامەی لەو دەمەدا .. لە دایك بوو.
زیندووە .. یاخود .. وەکو خۆم ..
ئەویش لە چاوتا .. مردووە ..
دڵنیابە .. ئێستەش .. لە نێو .. دڵی مندا ..
هاوار دەکات ..
دەڵێت .. گیانە ..
خۆی دەکێشا .. بە زەویدا ..







گەر تۆ لە تەنیشت منەوە .. نەبوویتایە ..
منی دەکوشت

***

## پێنج هەزار ناو

ئاورینگ .. وتی ..
لە من بێخەوش و بێگەردتر
ئەو خوێنە بوو ..
فەرهاد دەمی .. تەشوێی ..
پیرشت
مانگ وتی ..
لە تریفەی منیش جوانتر
ئەو ئێوارە .. پەمەییە بوو
( عومەری خاوەر )
لە باوەشی خۆی گرتبوو
وەلێ سبەینێ ..
من شیرین و..،
من کۆرپەلە .. تاقانەکەی ( عومەر )م بینی
لەسەر شەهیدێك وەستان و
یەکی مشتێ خوێنیان، لێ برد
ئەو کردیە .. شوێن برینەکەی .. فەرهاد .. و





ئەم لە دەست و ( پا )ی .. باوکی گرت
هەردووکیان زیندوو بوونەوە
ئەوان زەماوەندیان .. کرد
کچێکیان بوو ..
ئەمان .. یەکتریان دیتەوە
چوون بۆ خوازبێنی .. ئەو کچە ..
بۆ ئەو کوڕە .. تاقانەیەی .. کە پێنج هەزار
ناوی هەبوو

***

**ئاوێنە ..**

**لە پشت ئەو لاولاووەوە .. کە**

**بە شووشەی ئەو .. پەنجەرەدا .. هەڵزناوە**

**لە ئاست ئەو گوڵەمینایەوە ..**

**تەماشا .. کە**

**ژیان .. چۆن ..**

**گرفتار بووە**

**بە پێوانەی باڵای شەتڵێک**

**کە پری دارمێوێک دەبەستێت**

**لە چاوی سنەوبەرێکدا ..**

**دوا دێڕی دیوار دەنووسێت**

**ئەوەی دەستی ..**

**لە گەردنی .. ئەو قوڕەدا .. دێت و دەچێت**

**دەیەوێت .. بیخنکێنێت .. و**

**گوڵدانێکی لێ دروست کات ..**

**ئەوە بوو لە ناو باخچەکەدا**

**پەپوولەی دەخستە رستەوە**

**کۆمای دەڕشتە .. بەرپای ئاو**





**منم کە لە تەنیشتەوە**

**لەسەر پەنجەی پەلە پیتکەمەوە ..**

**دەڕوانیت**

***

## ترافیك

کەی گڵۆپی سەوز هەڵ دەکەیت
پۆلە مەلی .. دەنووك .. سووری
سەر گومەزی مەمکەکانت
بۆ پەڕینەوەی .. تەماشای من چۆڵ دەکەیت
ئاخر .. خۆ چەندین .. کوێرەڕێ .. و
کوچە و کۆڵانی دیکە هەن ..
( پێی ) سەر چەقۆی چاوەڕوانیم
بۆ سەر چیمەنی تۆ بێنن
چەندین بوار و بەردەباز ..
لە هزرمدا راکشاوە ..
پەلم بگرن .. بۆ ناو دەریای مەنگی جوانیت
نەهێڵن قولم تەڕ بێن ..
ئاخ .. جارێك لێمت دەپرسی
دەتپرسی بۆ .. راوەستاویت؟
لە وەڵامدا منیش دەموت
هەتاکو ئێستە نازانم ..





چاوەڕوانی .. فەرمانی لێوەکانی تۆ ..
بە چێژترە
یان ئەو ماچەی .. دێم و ..
بە زۆر لێت دەستێنم

***

## جیاوازی من و ئاو

حەزم دەکرد وەکو ( ئاو ) بام
هەرپای درەختی بەردارم
لەسەر سەر رانەگرتبا
قەدی تاڵی
داری گوڵەژاڵەشم وەك
دارهەرمێییەك خۆش ویستبا
وەلێ ئەفسوس
منی گرۆی ئادەمیزاد
پام لەسەر گوڵەژاڵەیە و
پەنجەکانم
بە گوێی گەلای هەرمێکانەوە گوارە
***





## براکوژی

بە من چی .. شاری چاوانت
تێیدا ونم
چی لە ئاوێنەی باڵات .. کات
بەفری سەرم
ئەو دەمەی تۆ گوڵفرۆش بووی ..
من شەڕفرۆش ..
تۆ هەڵوژەت .. گرتبوو .. کە
من مشتم .. لە خۆم گرتبوو..،
هەتا خووڕ بوو .. چەمی چاوم ..
بوار بەسەر .. پشتی تفەنگێکەوە بوو ..
هەتا .. گەشتم .. بە کەناری مێرگی سەوزت ..
ڕەنگەکان .. هەڵیانوەراندم ..
من گلەییم لە تۆ نییە
شەقامی بەر پەنجەرەکەت ..
وەك رێبوارێك دەبا ناوم
من پرسیارم لە تۆ نییە ..
خۆم وەڵامی ناو مێژوویەکی .. سواوم..
***

## ئای چەندە حەزم بەوەیە کە شا بمرێت

بلێی ئەم جەنگە راوەستێ
ئەم پە نجانەم ... مەرەخەس بن
لە سلاو بۆ سەر شانی ( شا )
نەختێکیش لەسەر گۆمەزی
منارەی مەمکەکانی تۆ
فێربن ... چەشنی باڵندە .. هەڵبنیشن
ئای چەندە حەزم بەوەیە ... کە ( شا ) بمرێت
هەر بۆ ئەوەی لە رێورەسمی .. مەرگی ئەو دا
خۆ بدزمەوە بۆت ( گوڵێ )
جگە لەم چەشنە پێلاوە
پێلاوێ تر لە ( پا ) بکەم
لە پەلکی گیا چێکرا بێ
جگە لەو چەشنە رۆشتنەی کە فێری بووم
نەختێ بەسەر فەرشی سووری تۆشدا بڕۆم
بێ تە پڵ و مارشی سەربازی
دەزانم تۆش .. بۆ راوەستانی ئەم جەنگە
کۆڵەواریت





بەلاّم نیگەرانی ئەوەیت
دەترسی شەوێك لە شەوان
گوێکانم بزرنگێنەوە ...
بیرم بچێت لە باخەڵی تۆدا نووستووم
دەست دەمەوە تفەنگەکەم
ئەو جوانییەی تۆش بکوژم

***

## سرودی ئەوین

هەر چەندە گوڵی گوڵدانێ تری
تەرزی سەرپە نجەی خوا پێداوێ تر
گەشتە هێشوی چاوەکانت و
بەر لە وادەی خۆی پێگەیاندن و
کردنی بە ترێ
بەڵام ئێستەکەش لە خەونی مندا
تۆ هەر بەرسیلەی
من هەر بەرچنەی حەز چێدەکەم بۆت
بشبیت بە مێوژ
گرنگ نییە بۆم
چونکە ئەودەمەی کە تۆ دەبینم
دەمم پڕ دەبێت لە ئاوی ترش

***





## خەمێکی گەورە

لە بروسکەی .. هەور دەترسێم ..
دڵنیام ..
رۆژێ لە رۆژان ..
چەخماخەی ئەو دەمسووتێنێ ..
چونکە لە تەنیشت منەوە ..
( ژنێك ) نییە ..
بە باوەشیدا .. هەڵزنێم ..

***

## ئوولفەت

بۆ بەهاری..،
چاوەکانی .. تۆ دەڕوانێت
پێی تەزیوی ..،
نێو لە پێ .. وەرزی .. ئوولفەتی
چوار ڕێیانم ..
لە بەد بەختیم ..،
ترافیکی دەستەکانی تۆ .. سەوز نابن
ناچار بووم ..
هێمای سووری .. یاساکانت .. ببەزێنم
ڕازی ببم ..
بە بڕیاری سزاکانت

***





## گلەیی

چاوەڕوانی .. بارانێکم ..
بە بیانووی .. تەڕ بوونم .. بێمە ..
ژێر باڵی چەترەکەتەوە
خەمی تەمی ئەو .. ئاسۆیەیی ..
کە ڕووی نەدیووی .. سبەینێی..،
بزر کردووم ..
لە چاوانتا بدۆزمەوە
لەو لێوانەت .. لێوم .. لێوان.. لێوکەم ..،
لە ماچ
بەڵام .. گیانە .. وا دیارە ..
پەرش و بڵاوی هەورەکان
پەلکەزێڕینەی مەبەستی ..
ئەم تەماشایەم .. ڕەنگ نەکەن
کورتی و کوێری..،
خوار و خێچی .. ڕێگاکان ..
وام لێدەکەن

گشت ڕەنگەكان ..

لەسەر زەمینی خەونەكان ..

بدەم لە خاچ

***





## گۆرانییەك بۆ سبەینێ

وەكو دوێنێ ..

هەر بەرد سەری شووشەی .. شكاند

چونكە لە چاوی .. شووشەدا ..

خۆر و .. ئاو و .. درەخت .. هەیە

چونكە..،

لە گیانی .. پەروانە و .. مانگ و..،

گوڵدا ..

شووشە .. هەیە

من ناڵێم .. تۆ ناسك مەبە ..

من نەمووت .. تۆ.. وەكو.. بەرد بە..

من دەمەوێت..،

خاك و خۆڵێك ..

لە بەرد و شووشە .. بشێلم ..

من دەمەوێت ..

ئەم جەنگە .. ڕابوەستێنم

***

## ترس

لەو دوو چاوەت
یەکێکیانم .. لێ داگرە ..
ئەم کرمێبوونەم .. یەکلایی .. بکەرەوە
با بێم ...
دەستەکانم .. لەسەر
ڕەفەی مەمکەکانت دانێم ..
پرچت بکەم ...
بە رووپۆش ..و
لە ئۆکسجینی .. هەناسەت
بەشی ئەو ڕۆژە .. هەڵمژم
تیایدا .. ژیان ...
دەچێتە .. ناو.. کیسێکەوە ..
لە ترسی .. گەستنی .. ژەهر

***





## وڕك

تۆ .. لە گەرمێنی .. چاوتەوە ..
بۆ کوێستانی .. سەری .. سپی .. من .. دەڕوانیت
بۆیە .. لە ئاست .. گرێدانەوەی ..
ئەم تەنافی ژیانە دا
پە نجەکانت .. ئاڵۆسکاون
جێی چینەیەك .. لە سبەینێمدا.. شك نابەیت
ئەی نازانی ...
هێشتا .. لە ژێر .. دار و پەردووی داروخاوی
ئەم عەشقەدا ..
دڵم پەمووی .. نێو قۆزاخەی
فرسەتێکە ...
بۆ .. ( جیکەنە )ی پە نجەکانی تۆ دەڕوانێت
بیکاتەوە و..
تەنافێکی نوێی .. بێ گرێی ..
لێ دروست کات

***

## نازناز

هەرگیز خەم بۆ گەڕانەوەی
هەتاو ناخۆم
کە ئێواران بزر دەبێت
لە پشت پەنجەرەیەکەوە ..
من دەڕوانم ..
بانیژەیەکی لێ دیارە
لەسەر ئەو بانیژەیەوە ..
کچێك .. ئاو دەپرژێنێت لە ..
گوڵی .. نازناز ..
گوڵی نازنازیش ..
سبەینان ..
گوڵ دەگرێت و
مژدەی گەڕانەوەی هەتاو دێنێتەوە
***





## شکایەت

چاوی شین بوو بوو ..
بە ئاسمان ..
لەپی پڕ بوو .. لە پاڕانەوە .. بۆ خودا
لێوی زەرد بوو بوو .. بە نزا ..
دۆزەخ .. دڵی .. وەکو هەنارێك گوشی بوو ..
کەچی بەرپێی
بە شکانی وردە شووشەی .. دڵێ سوور بوو
لە تەماشای ئەو دڵەدا ..
ئەو دولبەرە .. بۆ خۆی بوو بوو ..
بە پەرستگا .. و ئەو عاشقەش ..
بە خوای .. دولبەری دەفەرموو ..
تۆ شاهید بە .. ئەوەی لێت دەپاڕێتەوە ..
نەیسووتێنی ..
بە بڵێسەی .. ئەو جوانییەی ..
منی سووتاند
***

## گوڵی سوور

دوارۆژەکانی وەرزی زستان بوو ..
بەفر تەقەڵی دەدایەوە
لەو شوێنانەی ..
( چەند گوڵێ سوور )
کراسەکەی بەریان دڕی بوو ..
تا ئەوانی سەرکۆنە کرد
چەند گوڵێکی سووری دیکە
سەریان .. لە نێوو ..
تەماشایەوە .. شین بوو بوو

***





## توانەوە

پارساڵ .. تۆپەڵێك ..
بەفرت تێگرتم ..
لە کانییەکدا .. دیتمەوە ..
ئەمساڵ ..
چەند گوڵێکی ....،
بە باوەشیەوە .. گرتبوو
بۆ نێو مێرگێکی ..
سەوز دەچوو

***

## ڕێگای شیعر

بە هەر ڕێگایەكدا بڕۆین ..
دەچینەوە .. دووڕیانێك
كوێرەڕێیەك ونمان دەكات
ئاخری هەر ..
لە گۆڕستانێك لا دەداو ..
باوەش بە دوو كێلدا دەكات
كوا؟ ئەو كانییەی .. ئاسمان .. لە چاویدا نەبێت
ئەو درەختەی ..
( موتربە ) نەبێت بەوی تر ..
تام و ڕەنگی خۆیی .. پێ بێت
دەستت بێنە ..
ڕێگایەكی تر شك دەبەم ..
ناچێتەوە ماڵی مەرگ ..
ڕوو لە قاپی خێڵ نانێت و ..
درەختەكانی خۆیانن
لەوێ .. لەو مەملەكەتەدا ..
ئاو .. بێ ڕەنگە





مەلەكانی .. لەسەر پەنجەی .. پەلە پیتكەی .. ئینسانەكان ..
هەڵدەنیشن و ناترسن ..
بە بێ شمشێر ..
لەگەڵ خودادا دەپەیڤن
ڕێگایەكی تر .. شك نابەم
بێجگە .. لەو ڕێگایەی شیعر

***

## حەزێکی شێتانە

چاوی .. ئومێدم ..
خوڕەی کانییەك .. دەدات بە گوێدا ..
شنەی شەماڵێ .. چوارچێوە دەگرێ ..
دنیای خەیاڵم ..
لە ئاسۆی دوورما ..
حەزێکی سەرشێت ..
دەڵێ مەوەستە ..
سبەینێیە تر .. لە رووی نەدیوی ئەو پێدەشتەوە
لەمڕۆ شینتر و .. جوانتر ..، چاوەڕێی ..
گەیشتنت دەکات ..
چاوەڕێم بە دێم ..
سواری سەرپشتی .. ئەم خەونەش دەبم ..
گرنگ نییە لام ..
هەتاکو دەگەم ..
( با ) قەناعەتی .. ئەم گوڵدانانەی شکاندبێتم
ئەو چرایەشم بکوژێتەوە
هێرش بێنێتە ژوورەکەمەوە





شاری مۆم و گوڵفرۆشان سالار توتمانی

## باڵی تاریکی

مادام دڵنیام ..
چاوم پڕ دەبێت لە مێرگێکی سەوز
پام دەچەقێتە ..
جڵقاوی .. ئاوی ..
ناو دارستانێك
چەند کەنارییەك.. بەسەر دەستمەوە
دەنیشنەوە
ئەگەر هەر ئێستەش ..
بمرم .. پێموایە
کە گەشتووم

***

## سکاڵا

خۆ تۆ .. لە گوڵی درەختی هیوام
کش .. کش ..
چۆلەکەت .. دەر دەکرد
بە کەژکەژەی سپی سبەی
( داهۆڵت ) بۆ خەمم .. دەکرد
هەتا رەوە کوللەی مەرگ ..
بە سەرمدا .. رابوورن .. روو لە دەغڵی سەوزم نەکەن ..
ئەی بۆ .. ئێستە .. کە من .. رەها بووم .. لە خەمی ..
هەڵپێچانی .. گوڵەکانم ..
بەرچنەی حەزی تۆ گیانە ..
دوودڵ بووە .. لە گەینی پەنجەکانم ..
ئەگەر دەستوبردێك نەکەیت ..
منداڵێکی هاروهاجم .. بۆ لە باوەش .. نەگریت .. هەتا ..
دیلانێیەکم .. پیاهەڵخاو ..، دام وەرێنێت
دڵنیابە .. پەلەکانم .. دەشکێتەوە و ..
کەژکەژەکەی .. تۆش رەش دەبێت
***





## تکا

بە لەشکری ..،
بێ بەزەیی .. چاوەکانت ..
رابگەیەنە ..
دەست هەڵگرن ..
لە کوشتار و .. رەشەکوژی
داواکاری پەنجەکانم ..
کوفرم .. نەکرد .. بازی خەونی.. رزگار بوونم
لە تەنیایی .. باڵی گرت .. و
لەسەر پرچی .. رەشماری تۆ ..
بوو بە تاج و
کردیتییە .. پاشای وڵاتم ..
***

## خۆزیا

ئەگەر پەتی سێدارەیان
لە پرچت .. چێ بکردایە
من یەکەمین کەس دەبووم .. کە
سەرپێچیم لە یاسا دەکرد
چوون دڵنیام ..
پرچی تۆ .. کەس ناخنکێنێ
ئەو دەمەی لە گەردنم کرد
لەگەڵ جەستەم ..
دەکشێت و
هێدی .. هێدی
پێم دەداتەوە .. بە عەردێ

***







## زەنگ

وەرە .. تا مەرگ ..
نەیتەنیوە رێ ..
پردێ چێ بکەین ..
بۆ پەڕینەوە
ئەم بەردەبازە ..
هەر بوار .. نابێ
تۆفانێ دێت و ..
دەیسڕێتەوە
رەنگە .. تابووتێ ..
بمبا سبەینێ
هەر ئێستە وەرە ..
بەرچنەم پڕ کە
کە پرێ لەم لەحزە..،
چێ بکە ئازیز
چاوەڕێی تەونی ..
فەرشی خەون.. مەبە

***

## جوانترین ژماره

یەك و یەك ..
دەكاتە .. من و تۆ ..
دەكاتە .. درەختێكی .. دووپەل و ..
دەكاتە .. كۆڵەكەی .. راگری .. كوخێك و
دەكاتە .. ژمارە .. دوو
جوانترین ژمارەیە ..
ژمارە دوو ..
بڕوانە .. بۆ .. خوداش ..
چەند هێندەی من و تۆ ..
ئەم ژمارەی خۆش دەوێت
تەماشا ..
بۆ هەموو .. باڵندە و ..
مەلێكی .. كردووە .. بە باڵ .. و
بە دەنووك

***





## پەرلەمان

سەد و قسور سەنگەلیم هەس
بەلاَم ئەفسوس ...
لەگەڵ یەك كۆ ناكرێنەوە
وەلیٚ كاتیٚ كە لە یەكتریان دەر دەكەیت
دوو كورسی دەمێنێتەوە

***

## نزا بۆ بەفر

چرای سپی ..
ژێر ڕەشماڵی سەرم هەڵ بوو
فەرموو .. ئەی .. با ..
کامەیە .. کوانێ .. لوطفی تۆ ..
لە تاریکی .. تۆدا .. ئەی شەو
سروشت ون بوو..
سەرم ئاوی چاو دەبا ..
کوانێ حوکمی تۆ ..
نەرم داکەیت .. بەخوڕ داکەیت
ئیدی .. خۆ باران .. وەرزی ئومێدی من ..
نییەتی مەیلی ژوانی تۆ ..
موشتاقی بەفرێکم .. داکەیت ..
بمبوورە .. خوایە
دەمەوێت بچمە .. قاپی یار ..
ئەم تەوقە سپییەی سەرم .. بخەمە ئەستۆی .. ڕەحمەتی تۆ

***



شاری مۆم و گوڵفرۆشان
سالار توتمانی

## ڕەنگە

گوڵێ .. لە جێوە .. لە ڕێوە ..
ئەو پە نجانەت .. هەڵمەگرە ..
بۆ .. قاتوقڕی
بۆ زستانی شەختە و .. تۆفان و کڕێوە
من ئێستا کە موشتەریتم ..
بەو دوو سێوە ..
چەند بلێی قیمەتی دەیدەم
لەسەر لەفزێ کە دێتەدەر
لەو دوو لێوە ..
ئیتر بۆچی .. بە تەنافی .. سپێدەدا
چاوەڕوانیم ..
هەڵدەواسی
ماچێ کە ئێستا دەست دەدا ..
سبەینێی چی
ڕەنگە .. ئەو .. عەیامە .. لەبەر
چارەنووسی

### جەنگێکی تر دا

رچی بین ..
ئەی نازانی ..
ئێمە کوردین ..
رەنگە بووبین بە دوو رەنگ .. و
گەورەکانمان رێگا .. نەدەن ..
رەنگێکی نوێ ..
بۆ تەماشای روانین بگرین

***





## جێژوان

ئەوکاتەی خۆر ..
پێچی مێزەری زیوینی ..
لەسەر گوێژە دەکاتەوە
سێبەر بۆ چنینەوەی .. گوڵ
بەسەر باخچەکەی ( چێوار ) دا
دادێتەوە
بێ بڕوانە .. ئێوارانی سلێمانی
ورد ببەرەوە .. لە جوانی ..
ئەو ساتانەی
( سەیوان ) چراکانی هەڵدەکات
بۆ بەر پێی مانگ
را بمێنە .. لەو دەستانەی
خۆشەویستی ..
وەکو گوڵ .. هەڵپێچاون
بۆ بەرپشتێنی مەولەوی
دەڵێی چاوەکانی تۆیە

لە جوانیدا ..
ناسك وەكو پەنجەكانت
پرچی ژیان ..
دادەهێنێت
بۆی .. شنەبا ..
بێ راكشێین .. چاومان شین كەین ..
بە ئاسمانێ
ئەستێرەكانی بژمێرین
گەر سبەینێ منداڵێكی پێمان بەخشی
باوەش بۆ خۆر بكاتەوە
نەبا .. گیانە .. كە ئەو هەڵهات
ئێمە لە نێو .. تەماشای یەكدا
نووستبین

***





## ئەو منالەی چاوەكانی لە تۆ دەچێت

بێ .. با .. ئەم رێگا ..
بە چۆڵی نەڕوا ..
ئەم تەنیاییە ..
كەڵكی كێ دەگرێ ..
چەند بێ واتایە ..
روانین .. بۆ خودا ..
بە ئاسمانتەوە .. نەسوڕێتەوە
فڕینی مەلێ
لە لە نجەت .. پەنجەم .. موتربە بكە
بەر لەوەی .. تەرزەی
نەهاتی رۆژگار
دامانوەرێنێت
بەسەر لێومەوە .. ماچێ چێ بكە
نەك خوا نەخواستە
خەونی بەرسیلەی .. دنیای تەماشات
نەبن بە ترێ

ئەوسا .. لە جوانی ..
ئەو دیلانێیە ..
بڕوانە گوڵم ..
بە گەرد نماندا خۆی .. هەڵخستووە
منالێك .. چاوی ..
لە تۆ دەچێت .. و
چەچۆڵەکانی .. کە پە نجەی منن
توند توند گرتووە
من پشتی دەنێم ..
تۆش باوەشت بۆ .. ئاوەڵا کردووە ..
چەند جوانە .. هەر دوو ..
بەو هاتوچوونەی دەخەنینەوە
***



شاری مۆم و گوڵفرۆشان
سالار توتمانی

(……)

گەر دەتەوێت
لەو ساتانەدا سەوز بیت
کە گشت شتێك زەرد بووە
لە پێش چاوی گوڵدانسازێك
لەسەر رومەتی شینی باخچەیەك
گوڵدانێك بشکێنە
***

## نێرگز

ژنێکی ئەگریجە سپی
لە ئەنفال بەجێماو ... وتی
ڕەنگە ئێستە
ژنێکی ڕەشپۆشی عەرەب
ئێسك و پروسکی ...،
"شووە " کەی منی ..
لە بنۆڵەیە ... سپی نابێت
بەسەریدا هۆن ...، هۆن .. بگری .. و
پێی بڵێ ئەی خۆشەویستم
نازانم بۆ ...،
بۆ بۆنی نێرگزت .. لێدێت؟!

***



شاری مۆم و گوڵفرۆشان سالار توتمانی

## ئەنگوستیلە

لە گۆڕێکی بەکۆمەڵی ...،
بیابانەکانی باشور ..
مناڵێ کوردیان دیتەوە ...،
پەنجەی تەنیشت .. پەنجەتووتەی دیار نەما بوو!
یەکێ وتی
لە برسانا .. خواردویەتی ...،
یەکێکی دی ...،
پێی وا بوو .. لە زگماکەوە
ئەو پەنجەیەی ... هەر نەبووە
یەکێکی تر ...،
وتی .. ڕە نگە
ئەنگوستیلەیەکی زێڕی .. تێدا بووبێت
لە نێو پرۆسەی ئەنفالدا
"جاشێك " بۆدەرهێنانی .. ئەو
بڕیبێتی

***

## جگەرە

تاکێك کلاش .. و
منداڵێکی بێ دایك و باوکیان بیرچوو بوو
لە نێو شیعری شاعیرێکدا .."ئەنفالچییەکان"
شاعیرەکە ...
منداڵەکەی بە ئەستۆ گرت .. و
گەورەی کرد
بۆ سەندنەوە و هێنانەوەی .. تاکەکەی تر
وەلێ هەتاکو هەنوکەش
ئەو شاعیرە
بەو شیعرەوە .. گینگڵ دەدا
جگەرە لەسەر جگەرە ..
رۆشن دەکا و
چاوی لەسەر "تا " کەی ترە و
بۆ بەرپێی مستەشارەکان
فلتەرەکەی فڕێ دەدا

***





## پێڵاو

پێڵاوەکانم .. بەنەوە
بە کوڕەکەم
ئەمە دوا وێردی شۆڕشگێڕ بوو ..
بەر لە داردانی
جەلادێك
دەتریقایەوە و ...
دەیگێڕایەوە بۆ کوڕەکەی ..
لەو کاتەوە
ئەو جەلادە ..
هەزارەها جووتە پێڵاوی کڕیوە ..
ناگاتە ئەوەی لە "پا " ی کات
کوڕەکەی لێی دەدزێت و
دەیدڕێنێ
هەر بۆ ئەوەی لە پاش باوکی جێنەمێنێ .. و
ئەم لە "پا " ی کات

***

## تیرۆرست

به تەوێڵی چۆمێکەوە ..
کچەکەم پردێکی کێشا ..
لەمبەریەوە چەند ماڵێك و
خوێندنگەیەکی دروست کرد
پەلی چۆگەیەکی گرت و
درەختێکی بۆشین کردوو ..
کۆترێکی دەنووك سووری لەسەر دانا و
دیلانێیەکی پیا هەڵخست
بۆ پەرینەوەی
ئەو منداڵەی .. کە لەوبەرەوە ..
دەهات و
جانتایەکی لە شاندا بوو
تیرۆرستێك .. بەمەی زانی و
هات و پردەکەی تەقاندەوە
کچەکەشم .. قەڵەمەکەی دادایەوە و
ئەو بەریشی لە شێوەی ئەمبەر دروست کرد





لەو رۆژەوە .. تیرۆرستەکان ..
ناچار بوون ..
به خۆیاندا بتەقنەوە ..

***

## قەرە قووش

وتیان جەنابی قەرەقوش
ئەو کەسەی بڕیار بوو ..
کە بکرێت بە دارا ..
بالای زۆر کورتە و
گەردنی ناگاتە بەر پەتی سێدا رە
چار چییە
فەرمانت بە چییە؟
وتی بڕۆن بگەڕێن .. بە شاردا
یەکێ تر ..
بالای لەو بڵندتر
بێنن و .. بۆم بکەن بە دارا

***





**بەرهەمەکانی شاعیر**

١. چاوەکانی دێوانە — شیعر ٢٠٠٢
٢. ئالا — شیعر بۆ مناڵان ٢٠٠٥